حکومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# ئەلفبێی نوێ

## پۆلی یەکەمی بنەڕەتی





حکومەتی هەرێمی کوردستان- عیراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# ئەلفبێی نوێ

## پۆلی یەکەمی بنەڕەتی

ئیبراهیم ئەمین باڵدار

٢٧١٣ کوردی ٢٠١٣ زایینی

چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/ هەولێر



# دار

دار ، دار ، دار



دارا

دارا ، دارا ، دارا



دارا ، دارا

دار ، دار





# دار

دارا داری دی

داری دی دارا .





# داو

وی ، وی ، داو

داوی دارا، داو





# دارا

وەرە دەرەوە ، دارا

وەرە ، وەرە .

دارا ، وەرە دەرەوە.





# دوو دار

دارا دوو داری دی .

دوو دار

دوو داری دوور دوور .







# وازی

زارا ، زارا

وەرە وازی .

زوو وەرە ، زوو .





# دۆ

داده ، دۆ ، دۆ .

وەرە دارا ، وەرە ،

داده دۆی زۆرە .

دەی ، زوو وەرە .





# ئاو

ئای ، ئای !
دۆی داده ئاوی زۆره.
– ئۆی ، ئۆی ، دارا !
دۆ ئاوی وا زۆره.





# دادە

دادە ، دادە ،
وەرە دەرێ .
ئەوە ئازادە ، دۆی دەوێ
ئێ ، ئێ ، دارا
دادە وا دێ .





# ڕاو

زەردە ، زەردە ، وا ڕاوە.

دەی ، دەی

وا ئازاد ڕۆی .



ئۆی ، زەردە دەوەڕێ .

زەردە دڕە .

زەردە زۆر زۆر دڕە



ڕاو
ڕ



# دۆ ڕژاوە

ئازاد ، ئازاد ، وەرە ژووری

وا دۆی دادە ڕژاوە.

– ئۆی ، ئەوە دوو ڕۆژە دەڕژێ

دوو ڕۆژە دۆی دادە دەڕژێ.





# زریزە

ئای ، ئەوەی زریزەی دیوە .

زریزەی ئازاد ؟

— وەرە ، وەرە ، دارا .

ئەو زریزە زیوە زریزەی ئازادە ؟

ئەی ، ئەی ، ئەوە زریزەی ئازادە.





# داری درێژ

زارا ، وەرە ئێرە .

وا ئەو دارە درێژە ڕوواوە .

دەی زارا ، زوو وەرە .

ئەو دارە درێژە وا ڕوواوە.





# ئاودان

زاراو ئازاد وا دەڕۆن ،

ئەو دوو دارە ئاو دەدەن .

ئەو دوو دارە زوو دەڕوێن ،

زوو زوو ئاو دەدرێن .





# نازێ

دایە ، ئەوە نەوزادە .

وا دەڕۆینە ناو ئەو دارانە .

دەڕۆین دار دەڕوێنین .

– ئۆی ، نازێ ، دار دەڕوێنن ؟

دیارە ئێوە زۆر ئازان .

زوو وەرنەوە ، زوو .





# دار دەڕوێنم

دایە ، وا ئەم دوو دارە دەڕوێنم .

دوای ئەوە ، ئاویان دەدەم .

– وەرە نازێ ، وەرە .

وا دەڕۆین ، زوو وەرە

وا دێم دایە ، وا دێم .

ئەم دوو دارە دەڕوێنم .

دوای ئەوە دێم .





# مەڕە زەرد



ما ، ما، ما

مامە ، مامە

ئەمە مەڕە زەردە ،

مەڕە زەردی من



من دێمەوە مامە .

وا دەڕۆم ئاوی دەدەم ،

دوای ئەوە دێمەوە .

مەر
م



# مێوژی نایاب

ئەمەیە مێوژ ، مێوژی نایاب .

- مام زۆراب ، مام زۆراب

مەڕۆ ، مەڕۆ ، مێوژم دەوێ.

زوو وەرە ، زەینەب ، زوو.

دەی وەرە ، ئەمەیە مێوژی نایاب.





# بەبەی زەینەب

زەینەب ، وەرە ، وەرە .

مامە بەبەی بۆ ناردووی .

مامە بەبەی بۆ ناردووم .




بژی دایە .

بژی بابە .

بژی مامە .



# باران دەبارێت

ئای نەوزاد ، وا باران دەبارێت .

ئەمڕۆ ئاو زۆر دەبێت .

بە باران دار زوو دەڕوێت .

بنواڕە مام زۆراب ، وا دەڕوات .

دەڕوات بۆ بازاڕ ، مێوژ دێنێت





# تەیارە

بنوارن ، تەیارە ، تەیارە.

تەیارەی واتان دیوە؟

وا دەیبەمە ناو ئەو دارانە .

ئەوەی زوو دیتیەوە ،

دەبێتە تەیارەی ئەو .

ئازاد، تۆ دەتوانی زووتر بیدۆزیتەوە





# وس بە

وس، وس، دارا، بنواڕە ئەو تەیرانە ·



ویس، ویس، ویس




– ئای ، ئای ، ئازاد ، وەرە .

ئەم تەیرانە بەرە.

وس بە دارا، وس، وازبێنە.

بەس ئەوەندە ئازاری تەیر بدە.




# سێو

ئازاد ، سێ سێوم بۆ بەردەوە .

ڕاوەستە نەسرین ، با بەرنەبمەوە.

ئێستا سێ سێوان بەردەدەمەوە.

ئەوە سێوێ.

ئەوە دوو سێو.

ئەوە سێ سێو.

سێوی دیت دەوێ؟

بەسە ،بەسە ، نامەوێ.



# ڕۆژ باش

ڕۆژ باش بابە

– ڕۆژ باش ، نەسرین .

بابە ، ئەوە دەڕۆی ؟

منیش بێم ؟

– نەسرین ، ئێستا بۆ ئیش دەڕۆم

ئێوارێ دوای ئیش دێمەوە،

ئەوسا دەڕۆین بۆ دەرەوە .





# شووشه شیر

بنوارِنه ئەم شووشە شیرە،

شیری مەرِە زەردەی منە.

شیری مەرِە زەرد شیرینە.

وەرن دانیشن، شووشەی واتان دیوە ؟



ئێستا دەرِۆم دەیشارمەوە.

دەیدەم بەوەی بیدۆزێتەوە.

شووشە
شـ



# شەڕە مریشک

ئای بابە ، بنوارە،
وا دوو مریشک شەڕیانە .
دوو مریشک وەک یەک ئازان .
با تۆزێک نیسک ببەم بۆیان .
ڕاوەستن، شەڕە دەنووک بەسە .
ئێستا نیسک دەدەم بە ئێوە .





# کەوی من

دایکە ، دایکە

وا توتکە سوورو کەوی من یاری دەکەن.

کوت ، کوت ، توتکە سوور ،

نەکەی ئازاری کەوی من بدەی.

ئای ، وا کەوی من توتکە سووری ڕاونا.



کەوی من کەوێکی ئازایە .

کش، کش، کەوەکە، بە سە وازبێنە

کەو

ک



# یاریی تۆپ

نەسرین ، ئەوە یەک تۆپ بۆ تۆ.



تەپ ، تەپ، تەپ

– ئەی تۆپ بە من نادەی ، بابە ؟

نەوزاد ، ئەوەش یەک تۆپ بۆ تۆ ، باشە

• بژی بابە، بژی بابە،

ئەمڕۆ دوو تیپ یاری دەکەین ،

دوودەستە یاری بە یەک تۆپ دەکەین.





# پشە سپی

پشە سپی ، پش ، پش ، پش



میاو ، میاو

وەرە پێشەوە ، مەڕۆ،

ئەم پەنیرو نانە دەدەم بە تۆ.



میاو، میاو



زوو وەرە ، پشە سپی .

تۆ پشەی منی ، نەترسی.

پشە
پ



# سێ سەگ

ئای ، نەوزاد ، وەرە .

وا سێ سەگ یەک کەروێشک ڕاودەنێن .

پرشنگ بانگ بکە ، وا بۆ ئێرە دێن .

دەنگ مەکە ، با بێن .

– پرشنگ ، پرشنگ ، وەرە سەیرکە .

واسێ سەگ یەک کەروێشک ڕاودەنێن .

زووکە ، وا بۆ ئێرە دێن .





# کارە سپی

گدی ، گدی ، کارە سپی
تۆ من ناناسی ؟
گیات دەدەمێ گیا ، نەترسی
گدی ، گدی ، گدی
دایە گیان ، کارە سپی بگرە .
ڕەنگە بڕوات ، زووبە .
کارە سپی ، مەڕۆ .
ئەم گیایە دەدەم بە تۆ .





# مەل

ئای نەسرین ، بنواڕە مەل .

وا بە ئاسماندا پۆل پۆل دەڕۆن .

ئەوە یەک پۆل .

ئەوە دوو پۆل .

– نەوزاد ، ڕەنگە ئەوانە مراوی بن .



بۆیە وا مل درێژو زل زل دیارن.

مەل
ل



# بلوێر لێدان

بەزمە ، سەماو سترانە .

دەی ئازاد ، بلوێر لێدە سەیرانە .

بلوێرەکە باش لێدە گیانە .

لەم ناو لەمە سەماو سترانە .

بژی ئازاد ، بۆ ئەم بلوێر لێدانە .

دەی ، دەی ، بۆمان لێدە گیانە .

لم
لـ



# هێلکە

نەسرین ، بنواڕە ئەم هێلکانە .

ئەم هێلکە زەردو سوورانە

– دارا گیان ، یەک هێلکەم بۆ بهێنە ،

وا بۆت دەهاوێژم بنواڕە .

– هەی ، هەی ، نەکەی بیهاوێژی !

باشە نایهاوێژم ، نەترسی .

– هەربژی دارا ، هەربژی .





# ئاوازی گوڵ

هۆ هۆ ، کاکەی شمشاڵ ژەن گیان
ئاوازی هەی گوڵ لێ نادەی بۆمان ؟
وا بە بێڵ ، گڵ هەڵ دەکەنین .
نەمامی گوڵ دەڕوێنین .
- باشە شمشاڵ لێ دەدەم بۆتان .
ئێوەش بە بێڵ ، گڵ هەڵ کەنن .
نەمامی گوڵ بڕوێنن .



گوڵ
ڵ



# کاڵەک

دارا ، دارا
– بەڵێ بابەگیان ، بەڵێ .
وەرە ، ئەم کاڵەکەت بدەمێ ،
بە دایکت بڵێ ، بۆت لەت بکات .
تۆکڵەکەی باش پاک بکات .
– سوپاست دەکەم بابە .
بۆ ئەم کاڵەکە نایابە .





# كۆتر و ڕیشۆڵە

تەق ، تەق ، تەق

نەسرین ، ئەو دەرگایە بکەوە .

وا کۆترو ڕیشۆڵەم بۆ تۆ هێناوە .

– سوپاس ، سوپاس ، بابە گیان

هەندێ سلق وردکەم بۆیان ؟

بەڵێ ، بەڵێ ، ناسکۆڵێ .

لەگەڵ نانە ڕەق بۆیان دانێ.





# کەڵەباب وقاز

کەڵەبابە ڕەنگینە

بەقایم بقووقێنە ،

ئەو قازانە ببەزێنە .

دەی ، ئەوە بۆ ناقووقێنی ؟

ئەو قازانە ببەزێنی .

قازەکان ، وەرن بقیرێنن .

ئەم کەڵەبابە ببەزێنن .



 قی، قی ،قی  قوو، قوو، قوو

ها ها ، قایم نەبوو .

قاز
ق



# دیلانێ

گەلاوێژ گیان ، ئەوە دیلانێ دەکەی ؟

– ئازاد ، ئەی تۆ دیلانێ ناکەی ؟

وەرە لام ، من پاڵدە ، زووکە .

دوای من ، تۆش دیلانێ بکە .

باشە ، واهاتم ، باش دەست بگری.




بۆ ئەم لا و ئەو لا نەڕوانی ، با نەکەوی .



# کەف

ئۆف ئازاد ، ئۆف !

من بە تۆم گوت ، کوڕێکی باش بە .

یاری بە کەف مەکە .

تف لەسەر زەوی مەکە

- لێم ببورە ، دایە گیان .

لەمەولا یاری بە کەف ناکەم .




تف لە سەر زەوی ناکەم .



# فڕفڕۆکە

ئەها دایە ئەم فڕفڕۆکەیە .

من دروستم کردووە ، سەیرکە .

- ئافەرین دارا ، بیهێنە.

فەرموو دایە گیان ، بنوارە.

- ئافەرین ، زۆر باشە .

دانیشە، کفتەم بۆ لێناوی ، کفتە .

بۆت بێنم دوانی گەورە ؟

سوپاس دایە ، یەککفتەم بەسە.



فڕفڕۆکە

ف



# کەو

قاقبە قاقبە قاق

منداڵان ، ڕاکەن ، وەرن .

ئەو کەوە بەڕەڵا بووە ، بۆم بگرن .

دەی ، بڵاو بڵاو بوەستن .

ئازاد گیان ، تۆش ڕاکە ، زووکە

نزیك ئەو گەڵا و دارانە بۆی بوەستە

بەڵام ، یاری لە گەڵدا مەکە .





# مرۆڤ

گڤ .. گڤ ..

ئای ئازاد ، گیانە!

ئەوە بەرد دەهاوێژی بۆ ئەو کۆترانە ؟

تۆ نەتگوت ، مەل بەستەزمانە ؟

برام ، مرۆڤ وا ناکات .

مرۆڤ ئازاری مەل نادات.

– نەم زانی ، نەسرین گیان .

ئیدی بەرد ناهاوێژم بۆیان .





# گڤه گڤی با

وەرە ئازاد ، وا ڤرِە ڤرِ دێت .

ڕەنگە ئەوە دەنگی ئۆتۆمبێل بێت .

نازێ ، ئەوە بایە گڤە گڤی دێت .

ڤرِەی ئوتومبێل وا نابێت .

ڕەشەبا ، کە هەڵ دەکات ،

وەها بە توندی گڤە گڤ دەکات.

ڤرە ڤر
ڤ



# نانی ساج

نەسرین ئارەزووی کارکردن دەکات .

وا نانی ساج دەکات .

یارمەتی دایکی دەدات .

دارا قنج دانیشتووە ، سەیر دەکات .

سەرنج لە دەستی نەسرین دەدات .

لەولاوە زەینەب پێ دەکەنێت .




دەڵێ ، وا دایکم پلاوی برنج لێ دەنێت .



# جووجەکان





جیك ، جیك ، جیك

ئای ، جووجە جوانەکان !

وەرن ، وا جۆم هێناوە بۆتان



جیك ، جیك ، جیك

ڕاوەستن ، وا دێم بۆ لاتان ،

ئەوسا دەیدەم بە هەمووتان .

جووجەکان ، دەنووك نەدەن لە پەنجەم ،

بەشی هەمووتان دەدەم .





جو

ج .



# ورچ

ئای نەوزاد . وەرە بنوارە ورچ .
ئەو ناوە پڕ بووە لە کوڕو کچ .
ورچ لە سەر یەک قاچ وەستاوە .
دەوری بە کوڕو کچ گیراوە .
– ڕاست دەکەی ، ئەوەتا هەستاوە ،
کوڕو کچ دەوریان داوە .
هیچ کەس نەماوە لە کوڕو کچ ،
هەموو هاتوون بۆ سەیری ورچ .



ورچ
چ



# چالاک

چۆنی چالاک ، چاوەکەم ؟

– چاکم بابە گیان ، سوپاست دەکەم .

ئەوە بۆ کوێ دەچیت کوڕەکەم ؟

– دەچم سەیری ئەو بەچکە گچکەیە دەکەم .

نەچی، چالاک ، نەچی .

ئەو بەچکەیە سرکە ، نزیکی نەکەوی .

وەرە با بچین بۆ ناو ئەو گوڵانە ،

بۆ لای ئەو چۆلەکە جوانانە .





# شاخ

ئازاد ، بنوارِە قەد شاخ .

بنوارِە دیمەنی جوانی ناو باخ

وا دوو بەرخ یاری دەکەن .

بەپێ بەردو زیخ فرێ دەدەن .

– ڕاستە وا ڕادەکەن پخ ، پخ وا نەکەن.



ئازاد ، پخ ، پخ ، نەکەی دەترسن ،

ڕادەکەن بۆ ناو شاخ ، بزردەبن .

شاخ
خ



# نەسرین خان

بەخێر هاتی‌یەوە بابە گیان.

– خۆش بی نەسرین خان .

ئەوە خەریکی چیت کچی جوان ؟

– خەریکی خوێندنەوەم بابە گیان .

ئافەرین نەسرین خان !

وا خورمام هێناوە بۆتان .

هەستە بیخۆ لەگەڵ ماست و نان

– سوپاس بابە گیان ،

هەر خۆش بیت بۆمان .



خورما
خ



# گا بەڵەک

وەح ، وەح ، گا بەڵەک ، لاچۆ.
نەچیتە ناو ئەو گوڵانەم ، بڕۆ
گایەکی بڵح مەبە ، وازبێنە .
خێرا بڕۆ ، لێرە مەمێنە .

من وا یاری بە مزراح دەکەم .
پاسەوانی ئەم گوڵانە دەکەم .
بڕۆ ، با ئەم گوریسەت لە مل نەکەم.

مزراح
ح



# گوڵ و ڕێحانە

ئازاد ، بنواڕە ئەو حەوزە جوانە·
دەوری پڕە لە گوڵ و ڕێحانە .
حەز دەکەی ، بچینە لایەوە ،
تاکو ماندوومان بحەسێتەوە ؟
– بەڵێ ، منیش حەز دەکەم بچین
سەیری گوڵ و ڕێحانە بکەین .
هەندێک حەڵواش دەبەین ،
لەوێ بە یەکەوە دەیخۆین .





# بەرخ



با . ع ، با . ع

نەسرین ، ئەو بەرخانە چەند جوانن .

سەیرکە . وا بۆمان دەڕوانن .

ئەوانە لە دوو نەوع تێکەڵن .

حەوتی سپی و هەشتی ڕەشن .

دەزانی هەموویان چەندن ؟



– هەردوو نەوع پازدە بەرخن

حەوتی سپیو ، هەشتی ڕەشن .

با ع
ع





# عەلە شیش

عەلو ، عەلو ، عەلە شیش



علیو ، علیو ، علیو

– نەوزاد ، وازبێنە لەو عەلە شیشانە .

وەرە ، بڕۆین بۆ ناو ئەو عەردانە .

لەوێ هەندێک پەپوولە بگرین .

بەیانی بۆ مامۆستا عەزیزی بەرین .

ئازاد ، بەیانی جومعەیە .




ڕۆژی جومعان کوا مەکتەب هەیە ؟



# قەلە ڕەش

قغ ، قغ ، قغ

بابە ، بنواڕە قەلە ڕەشەکە .

چۆتە سەر قەراغ ئاوەکە .

خەریکە خواردن دەخوات

سەگەکەی من وا پەلاماری دەدات .

چغ ، چغ ، سەگەکە، نەکەی

پەلاماری ئەو قەلە نەدەیت .



قەراغ
غ



# غارغارێن

ئەو سوارانە غارغارێن دەکەن .

بە شیرو قەڵغانەوە غاردەدەن .

قەڵغان وەک ساج وایە ، تیغ نایبڕێ .

بۆ شەڕە شیر بەکار دێ .



وا سوارێک پێش هەموویان کەوتووە .

سواری ولاغێکی ڕەش بووە .

هەموویانی بەجێ هێشتووە .

غارغارێن
غ


ئ ئەستێرە
د بەرد
ف کەف
ه هەرمێ
ا داو
ر دار
ڤ مرۆڤ
ە دەستە سڕ
ب کەباب
ڕ فڕفڕۆکە
ق شەق
و چاو
پ تۆپ
ز قاز
ک دەنووک
ۆ نۆک
ت پەت
ژ ڕۆژ
گ سەگ
وو دوو
ج ساج
س داس
ل قەل
لا کۆلارە
چ وورچ
ش دارتاش
ڵ گوڵ
ڵا گەڵا
ح مزراح
ع جەمع
م مۆم
ی دەرزی
خ بەرخ
غ وولاغ
ن باران
ێ سێ



## ئاڵای کوردستانەکەم

ئاڵای کوردستانەکەم
ڕەنگی سوور بۆ خەباتە
سەوزەکەی وەک بەهارە
ئەو ڕۆژە ڕەنگی زەردە
بیست و یەک تیشکی پێوە
کاتێ کاوەی ئاسنگەر
ئاڵای کوردان شەکاوە
من خاوەن خاک و ئاڵام

بەفیدای بێ گیانەکەم
سپی یەکەی بەفری پاکە
ڕۆژێکی لەناو دیارە
دیارە کە کورد نەبەردە
بۆ شۆڕشی خاکە لێوە
لە زووحاکی گرت سەنگەر
زۆردار باوی نەماوە
بۆیە وا بەرزو باڵام

(شێرکۆ ئەحمەد)



# گوندی ئێمە

گوندی ئێمە ،گوندێکی خۆشە .
گوندێکە لەسەر چیایەکی بڵندە .
گوندێکی سازگار و زۆزانە .
واتا ، ساردو کوێستانە
پڕ لە گوڵ و ، باغ و بێستانە
هەموو لایەکی دارستانە .
گوندی ئێمە ، گەلێکجوانە .
گوندێکی ڕەنگینی کوردستانە.



# مۆسیقاو ستران

ئاهەنگە ، ئاهەنگی مۆسیقاو ستران
ئاهەنگی خۆشی دەستەی منداڵان .
وا دەست دەکەین بە ئاوازی نیشتمان
ئاوازی شیرینی کوردستانی جوان .
منداڵان ، ئێوەش چەپڵە لێدەن لەگەڵمان
بەدەنگێکی خۆش بیسەندنەوە بۆمان .



# یاری



به یاری له شمان ساغ و بەهێز دەبێ

خوێنمان پاک ترو   دڵمان خۆش دەبێ .

کێ دەزانێ یاری ی چاوشارکێ

یاری ی ڕاکردن و خلیسکانێ ،



یاری ی بازدان و تۆپانێ ؟

دەی منداڵان ، با ئەم یاری یانە بکەین ،

بێ ئەوەی تێکیان بدەین و کەس ئازار بدەین



# کاری ناوماڵ

منداڵان حەز لە ئیش و کار دەکەن ،

لە ماڵەوە یاریدەی دایکیان دەدەن .

وا هەموو ئیش و کاری ناوماڵ دەکەن .

نەسرین چا لێ دەنێ و پێ دەکەنێ .

نێرگز پیاڵە دەشواو ستران دەبێژێ .

دایکیان ماندووە ، چای دەدەنێ .



# کۆلارە

دایە گیان ، ئەوە دارایە ، غاردەدا ،
بنوارِە واکۆلارە هەڵ دەدا .
خۆزگە منیش کۆلارەم هەبوایە ،
لەگەڵ دارا غارم بدایە .
گیانەکەم ، یاریی وەها زۆرە ،
کە لە کۆلارە هەڵدان خۆشترە .



# سەردان

ڕۆژێک زارا چوو بۆ ماڵی ئازاد .
ئازاد بە گەرمی بە خێرهاتنی کرد .
هەواڵی پرسی و لەگەڵیدا پێکەنی .
بردی بە دایک و باوکی ناسی .
پێکەوە کەوتنە قسەی خۆش و یاری .
دوایی زارا زۆر سوپاسی ئازادی کرد ،
دۆعاخوازی لە هەموویان کرد .



# ترێ

مێوەکانی ماڵی ئازاد سێ جۆرن

هەموویان جۆری باش باشن.

هاوینان گەلێک ترێ دەگرن.

کە پێ گەیشتن هەموو لێ ی دەخۆن

بەشی خزم و دراوسێش دەدەن.

ئەوەی مایەوە دەیکەن بە مێوژو باسووق

بە سرکەو دۆشاو و سجووق.



# پشیلەکەم

پشە خرپنەی چاو کاڵ
خۆشە ویستەکەی ناوماڵ
ئەندام تووکنی خاڵ خاڵ
سمێل درێژی لووت ئاڵ .
بە خێر هاتی ، سەر چاومان ،
جێگات چۆڵ بوو لە ناومان .
تۆ لە کوێ بووی ، پشەی جوان ؟
بۆچی خۆت ون کرد لێمان ؟



– باڵدار–



# دەنگی مۆسیقا



گوێ ڕاگرن لەم مۆسیقاخۆشە.

چەند شیرینەو پڕ جۆشە .

ئێمە بە مۆسیقا دڵشاد دەبین .

بە چەپڵەوە لە گەڵیدا ستران دەبێژین .

کیژان و کوڕان ، هەموو دەست بگرن .

لە گەڵ ئەم مۆسیقایە هەڵپەڕن.

سوپاست دەکەین مامۆستا گیان .

بۆ ئەم مۆسیقا خۆشەی هانیوتە بۆمان .



# چیرۆک

ڕۆژێک زەینەب بووکی هەڵ دەپەڕان ،
گۆرانی دەگوت و دەستی دەجوولان ،
پشیلە جوانەکەشی بۆی دەمیاوان .
دایکی گوتی ، زەینەب گیان
وەرە ، بووکەکەشت بێنە لامان
گوێ بگرە ، چیروکێکت بۆ دەگێڕمەوە
لەم کتێبەدا نووسراوە بۆت دەخوێنمەوە .



# گوڵ چاندن

ڕۆژباش نێرگز

– ڕۆژباش جوامێر ، چۆنی ؟

سوپاست دەکەم نێرگز ، چاکم .

بێنە ، ئەو گوڵانە بۆ تۆ هەڵگرم .

– بژی جوامێر ، خۆم هەڵیان دەگرم .

ئێستا لە مەکتەب هەموویان دەچێنم .

حەز دەکەی چەند گوڵێـک لەمانە بچێنی ؟

بەڵێ نێرگز ، سوپاست دەکەم ، بژی .

# پەپوولە

پەپوولەی جـــوان و ڕازاو
ئێسک سووکی باڵ نەخشاو
تۆ ، کــەی هاتی بۆ لامــان ؟
بەخێر هاتی ، سەر چاومان .
چاوەڕێت بووین زۆر بەکـوڵ
بیــرمــان دەکــردیت بە دڵ
لێـــرە زۆرە دارو گـــوڵ
بفــڕە لەم چڵ بۆ ئەو چڵ .



— باڵدار—





# ماتانێ

ئازادو دارا یاری یان دەکرد .

ماتی شووشەی ڕەنگینیان ڕیز دەکرد .

نازێ ڕاوەستابوو سەیری دەکرد .

بانگی کرد ، زارا ، وەرە بنواڕە

وەرە ، سەیری ئەم ماتە جوانانە

سەیری ئەم ماتە زەردو سوورانە

با ملوانەیەک دروست کەین لەمانە .

زاراش گوتی ، گیانە ، ئەمانە ناکرێنە ملوانە .






# یاریی خوێندنەوە

منداڵان دانیشن ئەز دەبمە مامۆستاتان .

زەینەب ووریابە ، ئێوەش هەمووتان

هەستە ئازاد ، تۆ بخوێنەوە

چاوت بقووچێنە ، لێوت مەجووڵێنەوە

ها ، ها ، ها ، براکەم ، بیری لێ بکەوە

چاوم بقووچێنم چۆن بخوێنمەوە.



# نیگارەکانی نێرگز

نێرگز ، ئەم نیگارانە چەند جوانن .

ئەوە کێ نەخشی کێشاون ؟

– ئازاد ، ئەمانە من نەخشم کێشاون

ڕۆژێ نیگارێک دەکەم

ناوێکی خۆشی بۆ دادەنێم .

ئەمەیان چیرۆکی گورگ و بزن پیشان دەدات .

مام بزن لەقە لە سەربانی مام گورگ دەدات

مام گورگیش پرسیار دەکات ،

ئەوە کێ یە تەپە تەپ دەکات .
کاسەو کەوچکم پڕ لە خۆڵ دەکات ؟
مام بزنیش بە تووڕەیی دەبێژێ ،
ئەوە منم ، من منۆکێ
دووچاوم هەیە ، بز بزۆکێ
کێ خواردوویە کاریلەی من ؟
بێتە شەڕە جەنگی من.





# سالّ تەواو بوو

وا تەواو بوو ئەم سالّمان ،
سالّێکی خۆش بوو بۆ هەموومان .
پێکەوە دەهاتین و دەچووین
گەلێک شتی بە کەڵک فێر بووین
زۆر جێگامان دی و دڵخۆش بووین
تێر یاریمان کردو پێکەنین
گەلێک سەمامان کردو هەڵپەڕین .

گەلێک نیگاری جوانمان نەخشان
گەلێک دارمان چاندو ئاومان دان
سوپاست دەکەین مامۆستا گیان
خوا ئاگادارت بێت خۆشەویستمان
هەر بیرت دەکەین گەورەمان
خواتان لەگەڵ ، هەڤاڵان.

